*ناوی کتێب:حیکایەتەکانی ئەنفال

*بابەت: شیعر

*نوسینی:تەها سلێمان

*تایپ: نوسەر

*بەرگ: دیاری جەمال

*چاپ: چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری

*تیراژ: 1000 دانە

*ژمارەی سپاردن(264)ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە

## بەزام و حیكایەتی پڕلە ئێشی ئەنفال.... پێشكەشە

سەردارعەبدولاَ/سلێمانی

لە دواییدا ئەنفال كورت كرایەوە بۆ چەند ژمارەیەكی بیَ گیان، وبەتالَ لە مەعنا..لە دوا پلەی بەرجەستە بوونیدا ئەنفال بوو بە 182000 هەزار مرۆڤی بیَ سەروشوێن وچوارپێنج هەزار گوندی وێران كراو.ئەم قەوانەش هێندەمان لێدایەوە رۆحی دەربڕینمان لە بەر برِی ومراندمان...لە(حیكایەتەكانی ئەنفالدا)(تەها)پێمان دەلَیَ ئێوە درۆ دەكەن،ئەنفال ئەو قەوانە سواوە بیَ رۆحە نییە.بە سەر ئەو راستییە ترسناكەدا راماندەچەڵەكێنێت كە هێشتا نەمانزانیوە چییە.چونكە(خودایە چەند فەقیر بووین..،قومێك ئاو نەبوو بیخۆینەوەو،سێبەرێك نەبوو لە پاڵیا حیكایەتەكانی ئەنفال تەفسیر كەین)تەها راست دەكات(هەموو لەحزەیەك ئەنفال دەبێتە میوانێكی ناوەختی بیَ ئۆقرەی رۆحی)هەر بۆیە شێوازێك بوارێك بۆنەیەك لە دەست نادات بیَ ئەوەی برینە بە سوێیەكانی ئەنفالی تا سەر ئێسقان ئازار تێدا نەكولێنێتەوە.دوا كتێبی تەها لەم بوارەدا(پەراوێزی ئەنفال) وئەمجارەمان پێمان دەلیَ كە دەتوانێت بچێتە ناو دوو توێی برینەكانمانەوەو حیكایەتەكانی ئەنفالمان بۆ بگێرِێتەوە،دڵنیام ئەمە دوا قسەشی نابێت..من وەك پێشمەرگەیەك لە ناو چركە چركەی سوتان وقرچە قرچ وسوتانی ئەنفالدا ژیام یان مردم..،بەلاَم(لە ئەنفالدا زاكیرەمان خیانەتی لێكردین)بۆیە هەر چەندەم هەوڵدا نەمتوانی بۆ یەك چركە ساتیش تێبگەم كە ئەنفال چی بوو؟تەنها بۆ یەكجار لە چیانمدا هەمان چركە ساتی ئەنفال هەموو رۆحی برِ لە خوێن وقیژەو دووكەڵی خۆیەوە لەلام بەرجەستەبویەوە،ئەویش ئەو جارە بوو كە شانۆگەری(لە عەرعەرەوە)ی شاعیری گەورە قوبادی جەلی زادەم بینی،كەچی من چركە چركە لە ناو هەڵقرچانی خوێنی ئەنفالدا سوتام بەلاَم تا(حیكایەتەكانی ئەنفال)م نەخوێندەوە نەمزانی ئەو ژمارە گەورانەی باسی ئەنفالیان پێدەكەین چەند درۆیەكی بیَ دەسەلاَتانە بوو..ئەم حیكایەتانە باسی ئەو چركەساتە كارەساتاویە دەكەن كە(بەر هاتە قسەو ئێمە نەمانپەرژا ماڵئاوایی لێبكەین)باسی سوتانی مردنەكانی ئەو سەردەمەمان بۆ دەگێرِنەوە كە(جرجێك بوو بە سوڵتانی بیَ رەعیەتی نیشتمان)لە دواییشدا پێمان دەڵێت: ئەنفال شایەتەكانی خۆیلە سەر تەختەی جۆلانەی مناڵەكانمان هەڵكۆڵی.هەر بۆیە دەبیَ تەختە رەشەكان بسرِینەوەو سەر لەنویَ لە گەل حیكایەتەكانی ئەنفالدا تیَ هەڵچینەوە.

سلێمانی/سەرەتای 2003

بۆ تەها سلێمان

ئەنفال زیندووترین برینی کوردە. چونکە هەر بەبەر چاوی لاموبالات وگوێ نەدانی دونیاوە،بەبەر چاوی وەحشیانەو دڕندەیی دوژمنەوە،بەبەر چاوی بێ بەرنامەیی خۆمانەوە 182000 هەزار ئینسانی کورد،لە ژن ومناڵ وپیرو گەنجی کورد دیار نەمان یان ئاوا بوون..ئەمەش حاڵەتێکی نائاساییە بە قەدەر نائاسایی رووداوەکە.ئەنفال کراوان مرۆڤ بوون وەلێ ئاوابوون ودیار نەمان تا قولایی ناخ ون بوون،کە ئەمەش حاڵەتی ئاسایی لە ناوچونی مرۆڤ نییە کە مردنە.نازانم..ئیتر چۆن لە ولاتێکدا لە بەهاردا چاوەڕوانی گوڵ ولە زستاندا چاوەڕوانی بەفرو لە پاییزدا گەڵاڕێزان ولە هاویندا چاوەڕوانی هەتاو بکەین کە مرۆڤی تیا ئاوا دەبێ نەک مانگ.

تەها سلێمان قەڵەمێکی بە ویقاری ئەو کێشەیەیە بە نوسین وبە شیعر جیاوازی ئەم قەڵەمە وقەڵەمەکانی تر تەنها شوشەیەکە کە ئەم لەم دیوەو ئەوانی تر لە دیوی ناوەوەین،کاتێ باس لە کولانەوەی برینی پیرێک دەکات،باس لە نوێژی بە پەلەو پێش کۆچی پیرەژنێک دەکات،باسی داپیرەو با پیرەی خۆی دەکات.

هاوڕێم تەها گیان رەنگە هێندەت بەس بێت کە پیرەمێردێکی خوێندەواری گەرمیانی لە باسی تۆدا وتبوی(ئەم کوڕە دەستی لە سەر برینەکان دادەنێ وزۆر راستەوخۆو راستگۆیانە باسیان دەکات)

عیسا چیایی/دەربەندیخان

ئاوە سپی،(1)
لە دەروازەی ماڵی گەورەی خۆیدا
وای نووسیبوو:
کە دێنەوە؟
وەکاشە،(2)
ئاوای گێڕبووەوە:
بێوارترین کەسم و
شک نابەم کەسێ تەنیایم بدوێنێ..
سەنگە سار(3)بەرێبوارێکی وتبوو:
بەبیانی لم بڵێن..
با ئێسک وپروسکی کەسەکانم،

ئامانەت بێ لای ئەو
مەلا یەك جبەو مێزەرەكەی فڕی داو وتی:
قورعانەكەم وای پێوتم..
تەماشا،
ئەو داپیرە چۆن یاخەی مانگە شەوی دادڕی و
دەڵێ:
كوا تریقەی پێكەنینی كچە گەردن بلورییەكانم..
سەیری ئەو منالە بكە سەری خستوەتە نێوان هەرتك،
ئەژنۆیی ولە بەر خۆیەوە ئەڵێ:
ڕەنگی پێستی باوكم،
لمی،
یان،
خۆڵین،
بوو؟
بنوارە ئەو كلاو كوڕەیە..
ئەو ساو ئێستاش وێڵە بەدوای دیتنەوەی بێچۆكانیدا.
كانیەك دوای ئافتی ئەنفال،
هەنووكەش نەیتوانی چاوی بە سورمەی باڵی پەپوولەو گیا
نەعنا،
بڕێژێ و
پەلەوەرێك،
تێراو
بكا..!!
گوێیگرە ئەو بەردەجی دەگێڕێتەوە:
كە چەكمە لە پێكان هاتن..
بێدەنگی منیان هێنایە قسەو
ئەوان:
چ جوانی بوو ئەنفالیان كرد..
بێشكەی منالانیان پڕ كرد لە bارووت..
ریشی سپی پیاوە نورانیەكانیان،
هەڵكێشا..
مەمك دانی كچە عازەبەكانیان پڕ كرد لە،
لیك..

فەنەرییان لە سەر زاری مردووەکانمان،
دانا...
لە تارای سپی زاواو بووکێکا،
دوو پشک بوون و
هاتن:
تەماشا،
چی ئنیسان،
بوو،
بردییانن..
لە بەر کۆڵی عەسرە چای گوندییەکاندا،
ڕەنگی ئەنفالیان داچاند..
گۆرانی کوختی یەکانیان خنکاند..
دەستیان خستە بینە قاقای هۆ هۆی سەپانێک و
تاساندییان..
بۆنی مەرگیان داباران و
دڵی سۆزی شمشاڵێکیان شکاند..
لە وێوە،
بەسەر سیراتی بە ئەنفال چنراودا،
پەڕێبوونەوە
دەنکووکی،
چی،
پەلەور،
بوو،
بە،
چەقۆ،
بڕییان..
نەبادا،
سەر بوردەی حیکایەتی ئەنفال بگێڕنەوە..
لە وێوە،
خوا،
قورعان،
پێغەمبەیشیان،
فریو دا..

لەسەر رەنگی هەموو درەختەکان،

ئەنفالیان هەڵکۆڵی..

بۆ هەوەڵین جار،

با-

بە نەزاهەتی خۆی لەگەڵ کردنی..

کەبۆنی تورەکەیەک ئێسک وپروسکی،

بۆ هێنایەنەوە..

لە،

بۆنی،

ڕەنگی،

-با –دا،

نوسرابوو:

حەیرانێک بەکوڵ دەگری..

قەتار ئەلاوەیسی یەک ئەنفال کرا..

هۆزەیەک هەموو ڕێتمەکانی لێ تێک چوو بوو..

ئایی کە چەن بێکەس بووین و

چۆن شکاین.

ئایی کە چەن بێوار بووین و

چۆن ئەنفال کراین..

نە خوا بەحیکمەتی خۆی لە گەڵ کردین و

نە پێغەمبەرێک بەیداغی سپی بۆ هەڵکردین..

وەرە،

دانیشە،

تەماشا:

کە ئاسمان شکاوە وەحی ناردە سەر زەوی..

تیایدا بۆ ئێمە،

ئەنفال ماڵێک بوو لە زنهار..

بە خەتە بزماریەکانی جەهل نوسرابوو..

لە نوکی شمشێرەکەی عومەرەوە دەتکا..

بە عەبا بەسەرەکانی دوورگەی خوێن سپێر رابوو..

لە،

شکانی،

ئاسمانا،ئەنفال دەبارێ و

لە بارینی ئەنفالا،

ئۆمەتێک دەمرێ..

درزی شکانی،

ئاسمانا،

لەنامەی پەیامبەرێک نوسرابوو:

ئەنفال،

بە،

کزە کزی،مناڵێکەوە،

بخۆن..

ئەنفال،

بە،

لە،

ناو،

بردنی،

ئۆمەتێکەوە،

پێناس،

بکەن..

ئەنفال لە فەرزەکانی ئێمەیەو

سونەتەکان ڕەو دەکات..

لەوەرزی کێومالٚ کردنەکەیدا،

جیٚ بۆ باڵدارێکی تەریویش ناکاتەوە..

ئەو،

ئەنفال،

کە هات:

کوێرە کانیەک نەما بۆ جیٚ ژوان

کەڵەکێک نەما بۆ گوێگرتن لە گۆرانیەکانی دیٚ..

سێبەری سەکۆیەکی ئێواران نەما،

بۆ خواردنەوەی دژلەمەیەکی تر..

پیاوێکی نورانی نەما،

بۆ گێڕانەوەی سەر بووردەی ڕووداوەکان..

دیوەخانێک نەما،

کانیەک نەما،

تاقسەو باسی عاشقەکانمان لەخۆ بگریٚ..

قوتابخانەیەك نەما،

تاتیایدا منالان بنوسن:

دارا دوو داری دی لەسەری ئەنفال هەلکولرا بوو..

ئەنفال،

کل و کلدانی،

کچە عازەبەکانی دزی

ئەنفال

ڕۆحیانەتی پاکی،

لالە ئەحەی دزی[شم]

ئەنفال

کێلی گۆڕەکەی،

دەروێش عیسای شکان و[لە]

کەرە دانەکی سەید دلبەری لەوتاند[لی]

ئەنفال

دلی گەورەی ،

مەلا ڕەحمانی ڕەنجاند.[بی]

پێی ووت:

هیچ شتێ بەخولق تەنگیتا ناگا..

ئەنفال،

مەلا وەهابی،[تی]

بێ چارە کردو

پێی ووت:

ئیتر ناتوانی فەرزی نوێژەکانت ئاداکەی..

ئەنفال،

بە نامیقی پیرە مەوەنی ووت:[نی]

ئیدی ناتوانی لە دەروازەی ئاوە سپی دا،

ئۆ هۆ لە گەلەمێکەت بکەی..

نامیق،

بە،

---

عەزرەتی،

مەرِەکانیەوە،

مرد..

نامیق،

بە،

ئەنفالی،

ووت:

ئەویٚ رِۆژ تۆم ناسی کە پێیان ووتم شێت و وێت..

ئەنفال،

باخچەکانی،

پرِ،

کرد،

لە،

چەقۆ..

ئەنفال،

بۆیمەی قەیرە ژنەکانمانی سوتان..

ئەنفال،

بە گریانەکانمان پێدەکەنیٚ..

بەتازەشاری[بیتر] ووت:

دواین بەرەنگاریتەوە ئیتر تەواو..

خودایە چیت کرد؟

بۆچی لەشکانی ئاسمانا ئەنفالت داباران؟

خودایە،

ئەنفال،

بۆ،

با خەڵی،

خۆت،و

پەیامبەرەکانت،

بەرەوە،

خودایە،

((انا،

انزلنا،

---

10

قرانا،

عربيا،

لعلكم،

تعقلون))،

بدە،

بە،

ئۆمەتێکی عاقڵ و

با ئەم هەموو ئەنفالە بەس بێ..

ئەنفال،

دەسە،

خوردی،

گاوە سەکەی

"زەریف"[ىتريتر]ی

شکان و

قسە،و

گفت و

گۆ،

گەرمەکانی،

(وەهاب حکیم)[ىيريتر]ی،

دزی..

ئەنفال تاڵانی کردین..

ئەنفال تینووی کردین..

زمانی لە گۆ خستین و

جەلەی پێشۆکەکانی بەر پشتێنمانی دزی..

سەلکی هەڵە کۆکەکانی پێ تفاندینەوە..

تەماشا،

کە ئەنفال دێ..،

ڕێی باوانمان لێ تێک دەچێ..

کە ئەنفال هات..،

بەهەمووانی ووت:

ئەنفال لەمنەوە بۆ ئێوەیە..

ئەنفال ئاسمانی فریو دا،

کە لەکاتی شکانا لێی کەوتە خوارێ..

ئەو،

ئەنفال،

لەبەردەم،

ماڵی،

پەرە سێلکەیەکدا،

جاڕی،

ڕەو،کردنی،

دا..

ئەنفال،

تێزاب بوو ڕژایە نێو دەروونمانەوە..

ئەنفال،

قەفەسی تەنیایی بوو تێی ئاخنراین..

لەوەرزی،

بارینی،

ئەنفالا،

تاڵ تاڵی مووی چەناگەمان وەری..

ئەنفال،

ڕۆحی،

پارچە،

کردین،و

وردە،

شوشەی،

ختە،

توێی،

نازە،و

نا خوێنمان..

ئەنفال بەتاڵی کردینەوە لە خۆشەویستی..

پڕی کردین لەبێ هودەیی..

خەزێمەی بوو کێنی دایکمی دزیو

مردووەکانمانی مراندەوە..

خەونەکانە بەتاڵ کردینەوە..

خەونمان دەبینی..

لەخەونمانا،

نازە،و

نا خۆێنمان..

ئەنفال بەتاڵی کردینەوە لە خۆشەویستی..

پڕی کردین لەبێ هودەیی..

خەزێمەی بوکێنی دایکمی دزی و

مردووەکانمانی مراندەوە..

خەونەکانی بەتاڵ کردینەوە..

خەونمان دەبینی..

لەخەونمانا،

مناڵێک،

وای،

بۆ،

گێڕانەوەی،

ئەنفال،

لێکی ترازاندین و

کۆژەکەکانی بەر تویێڵمانی وردو خاش کرد..

شیروان[سمتر]–ووتی:

چەرمی،

سەری،

پۆلێک،

مرۆڤی،

ئەنفال،

کراو،

لاکێشەی هەواڵەکانیش نەیگرتنەخۆ..

شیروان،

بە،

هاوڕێ،

کەی،

ووت،

با،

---

بێرەدا،

نە،

ڕۆین،

بۆنی دووکەڵی لێ دێ..

ئاتیلا[شمتر]،

بە،

دەزگیرانەکەی،

ووت،

کچی،

نورانی،

ترین،

پیاو،

وەرە،

مەڕۆ،

با،

بۆ،

مێژوو،

ماڵی چێ کەین لە حیکایەتەکانی ئەنفال..

کوڕەکەی(ڕەشید خەلیفە)[لهتر]ووتی:

خەونم،

دیوە،

شمشاڵەکەم،

دەشکێ..

لە شکانی شمشاڵەکەمدا،

خوشکە،

قەیرە،

کانم،

بە،

کەسەری،

جێ،

کردنی،

---

14

15

**ماڵەوە،**

**سەر،**

**دەنێنەوە..**

**لەشکانی شمشاڵەکەمدا،**

**مەرێکی،**

**پەرم،**

**بزر،**

**دەبێ..**

**لە شکانی شمشاڵەکەمدا،**

**تیژە[لیتر]–مردو..**

**چیمەن[بیتر]– گۆڕ غەریب بوو..**

**ئەنفال،**

**مەسینەکەی لالە حمە جانی[تیتر]شکاند..**

**ئەنفال،**

**تارمایی ڕەششبەڵەکێکی کردە واوەیلێ..**

**ئەنفال،**

**شەوارۆی بە شوانێکی حەنین کرد..**

**ئەنفال،**

**ڕەنگەکانی لێ پاش و پێش کردین..**

**ئەنفال،**

**بۆ هەتایە لێکی ترازاندین..**

**لە،**

**دا،**

**با،**

**رینی،**

**ئەنفالا،**

**دایکم مناڵێکی بوو ناوی نا:**

**ئە،**

**ن،**

**فا،**

**ل..**

---

خوشکەکەم کراسی یەکەمشەوی بوکێنی دڕی و

درەنگانێ لە ماڵ چووە دەر و

نەماندیتەوە..

فانۆسی ماڵەکەمان کوژایەوە

سەگە بەوەفاکەی باپیرم،

لە حەپەحەپ کەوت...ز

جەلادێکی باسکی تاقانە کچێکی گرت و

نەوسنانە،

تێی،

ئەڕوانی،..

بەهاریان[*]"بە کچێنی بردو

بە،

ڕەوێک،

مناڵی،

بێ،

باوکەوە،

هاتەوە..

ئەوان بەتاڵ بوونەوە لە ئینسانیەت..

ئێمە،

بەتاڵ،

بوینەوە،

لە،

ورە..

ئەوان پڕ بوون لە چڵێسی..

ئێمە،

بەتاڵ،

کراینەوە،

لە،

عەشق..

ئەوان پڕبوون لە قاقا..

ئێمە،

بەتاڵ،

---

بوینەوە،

لە،

شەو،

چەرەی،

دیَ..

ئەو دەمەی ئەنفال لەگەڵ شکانی ئاسمانا دزەی کردو

دابەزیە سەر زەوی..

شینایی ئاسمان ڕەش داگەڕاو

بۆنی بخورٍ کەوتە نیَو دواماڵی تەنیایی..

ئەنفال،

لەسەر دەستی منالٌیَك،

پەساپۆرتی خۆی هەڵکۆڵی و

لە تەویَڵی ئافرەتیَکی نوسی:

بۆ فرۆشتن..

لەسەر گۆڕیَك نوسی:

بۆ بەردەوام بوون لەسەر مەشقی ئەنفال..

لەسەر کولانەی مریشکیَك نوسی:

بۆ سەرپەرشتیارانی جەلادان..

لەسەر گویَی میَیەکی شکیَر نوسی:

بۆ ژنی سولْتان..

ئەنفال،

دەمی پڕ کردین لە دووکەڵ و

قەپی کرد بە زمانمانا.. و

لەسەر بەرماڵی مزگەوتەکان نوسی:

بۆ عیبادەتی ئەنفال..

لەگەڵ هاتنیدا،

سەوزەی[***] "کوڕەزاکەی فەرەجی بۆ دۆزەخی لم ڕاپیَچ

کردو

جاجمی،

خەزانی،

بەسەردا،

داین..

---

چاوی گشتمانی بە شمشێرەکانیدوورگەی مەرگ تەقان..

ئەنفال،

دڵی گشتمانی دایە دەست کێردەکانی جەلاد و

جەلادیش قەبارەی غەزاکانی خۆی خۆی پێ زیاد کرد..

پڕبووین لە ئەنفال،

بەتاڵ بووین لە ئومێد..

پڕبووین لە ئەنفال..

بەتاڵ بووینەوە لە خەون..

پڕبووین لە ئەنفال..

بەتاڵ بووین لە بەهار..

ئەنفال،

مەرگ دۆستانە هات و

قورقوراگەی قوڕە ژیلکەی دەرهێنا..

ئیتر لەوێوە کات و ساتی داهاتنی بەهارمان بیرچووەوە..

حمە جانی ئەنفال،

ئەو...

ئێستاش شۆفێرەکان هۆشدار دەکاتەوە،

لە ئەنفال..

حمە جان،

ڕۆشتنەوەی بۆبنەی خەپە کوێر ئیزنداو

پێی ووت:

من و تۆ،

ئیتر ناتوانین،

پێکەوە بژین..

ئەو..

دەڵێ:

لەوێدا مەسینەکەمیان شکاند..

لەوێدا ماڵەکەمیان خاپور کرد..

لەوێدا،

ئاتیلا،

و،

فاتمەی،

یان،

لە،

ئەک،

کردو

لەوێدا،

بە بەرچاوی خواوە ئەنفالیانکردین..

لەوێدا جارێیان دا بمرین..

مردن بە ئازارەوە و

ئازار بە ئەنفالەوە..

وە هەرتکیان بەسوێی برینی کەسەکانمانەوە..

حمە جان دەڵێ:

دەرۆم بۆ خەڵوەتی بێدەنگی..

لە بێئۆقرەیی رۆحما،

گوێ بۆ حیکایەتەکانی بێکەسیم رادەخەم..

لە حیکایەتەکانی بێکەسیما،

ئەنفال سەری سۆراخی سەخڵەتیم دەخوا..

لەوێندەری بێکەسیما،

شتێ هەیە بە ئاوی زێر لە لاپەرەی مێژووی جەهلا،

نوسراوەتەوە...

لەیەکەم لاپەرەی زەردەوە بووی مێژووی جەهلا،

مەلۆتکەیەکی بێ کفن و گۆر،

یەخەمان رادەوەشێنێ و

سنجاق دەکا بەزمانمانا..

ئافرەتێک بە کراسێکی کودەری رەشەوە،

بێکەسی حیکایەتەکانی بێدەنگیمانی دەدواند..

پیاوێکی نورانی،

بەریش و پرچێکی سپی چوون بەفرەوە،

پارایەوە،

بۆ ئەوەی،

هەواڵ،

تاقانە،

کچەکەی،

پێ،

بڵێن..

لەدەفتەری یادگاری بازۆکەدا[تریر]نوسرابوو:

تەنانەت:

گویٚ دریٚژەکانیش بەبیٚکەسی ئەنفالکردنمانیان،

دەزانی..

ئەویٚ دەم بوو،

چەوری[یریر]بەبازۆکەی ووت:

برِۆ با ئەنفال نەتکا بە رِەژوو..

برِۆ با ئەنفال فریوت نەدا..

ئەنفال،

تاریقی[سمیر] خستە کۆشی جاجمیٚکی رِەش و

بە بیٚکەسی سپارد..

وەرە،

دانیشە،

تەماشا،

رِیزیٚک جەللاد،

(غوصل)لە کانیەکەی وەلی[شمیر]دەکەن و

پیٚی دەڵیٚن:

برِۆ تەرمەکەی لالە ئەحە بکە بەژیٚر گڵەوە..

دەستەیەک سەرباز،

بەبرِیاری جەللاد،

ئافرەتیٚکیان،

ئیغتساب،

کرد و

بەهەوریەکەی ملی خنکاندیان..

ئافرەتیٚک،

بەدەم رِیٚوە،

مناڵە تازە بووەکەی

فرِیٚدایە،

نیٚو،

گەنمە،

---

قەناریەکان و

ووتی:

مەرگ بۆتۆ عەزیزی من..

بیٚ سەرو شویٚنی بۆ دایکت باوانم..

ڕەویٚک،

کوڕ کوڕ،

بەتەئەسوفەوە،

چوونە بەردەم،

مالۆتکەیەکی لە عیٚل،

بە جیٚماو،

پیٚیان ووت:

وەرە لە دالٚدەی بیٚ دالٚدەیی ئیٚمە ستر بگرە..

پۆلیٚک تەیروول ئەبابیلە هاتن و

نەیان توانی هیچ بلٚیٚن..

کارمامزیٚک بە حوزنەوە دەگریاو

ڕووە قیبلە قورعانیٚکی هەلٚگرتبوو..

لە دووتویٚی بوخچەیەکی پرزە لیٚ براودا،

کە تاعونی ئەنفال دابوی بەدەم دیجلەداو

دیجلەش لەگەلٚ بەزەیی نامەیەکدا ،

بە قاچاخ بۆی پۆست کردینەوە..

تیایدا نامەیەکمان دیتەوە،

لیٚی نوسرابوو:

«بیرتان نەچیٚ سعوریان ئاویٚزان بە هەراسانی

کردین و زاکیرەیان پڕکردین لە لم،لە خویٚنی

جەستەی خۆمان تینویٚتیان شکاندین،

جامانی و

کراس و

دەرپیٚو

هەوریٚو

بۆیمەکانیان،

بەبەر چاومانەوە سوتاند..

تەزبیحەکانی دەستی دانە دانەمانیان،

بڕیەوەو

مناڵە زۆڵەکانی بیابانی لمیان پێ دەژمارد،لە

سەر نینۆکەکانمان حەرفەکانی فیراقیان هەڵکۆڵی،

کوژەکەی سەری مناڵەکانمانیان بە باقەیەک پرچەوە

هەڵکێشاو

فەنەریان خستە توێ توێی دڵی هەمووان،

ئەو ئێوارانە مانگ کراسی خوێنینی لەبەر کردبوو،

کەسێک نەبوو پەلکی کچە قەیرەو تازە باڵق بووەکانمان

دابێنێ،

ناسنامەی هاولاتی بوونیان لێ سەندینەوەو تەوێڵمانیان

بەتف سواخ دا،

ئای لەوێ چەندین مناڵی زۆڵیان پێ خستینەوە،

پەنجەرەیەک نەبوو لێیەوە داهاتوومان ببینین،

ئای لەوێ دنیا چی ئاشی ئاشوبێکی دەگێڕا،

لەوێ هاوڕێی خۆ خواردنەوەو هیچی تر بووین،

لەوێ نەمانتوانی دوا هەناسەی مەرگ هەناسەکانمان

بلاوێنن،

خودایە لەوێ چەن زەلیل،

چەن بێکەس،

چەن بێ چارە،

چەن بێ مەئوا،

چەن بێ ئۆقرە،

چەن بێ بارانی موحیبەت،

چەن بێ هیوا،

بووین..

لەوێ لەبارانی سۆز و خۆشەویستیدا بەختمان کوڵ بوو،

لە گفتوگۆی حەنین دا لێوان لێو بووین لە عەزاب،

چەن فەقیر،

چەن بێ قەرە،

چەن داماو،

چەن بێ کەس بووین..

لەوێ گشتمان ماندوو پرزە لێبڕاو بووین،

شەڕمان لەگەڵ گەردەلول و لمی بیابان پێنەکرا،

تەیموریش نەیتوانی وێنەی ئێمە وەک خۆی بگەیەنێ،

لەویٚ،

لەو،

عەزابەدا،

چ دادو فیغانیٚک فریامان نەکەوت..

لەویٚ،

لەو،

عەزابەدا،

نازانین گوناحەکانمان وەرین،

یان،

زیادیان کرد..

کات مەغریبەو

لە خۆرهەلاٚتەوە ئەنفال بۆ ئیٚرە دیٚ..

لە خۆرئاواوە لەگەلٚ زریکەی منالٚیٚکا،

هەوالٚی سەرکەوتنە وەهمیەکان دەبیستم..

لیٚرە..

هەموو فەجریٚکی بەیانیان،

لەگەلٚ سلاٚوەتەکانی داپیرەما..

ئەنفال بە پشکۆی سوتانەکانمانەوە،

جیٚمان دیٚلٚیٚ و

دەست کەوتەکان بەسەر جەنگاوەرەکانیدا،

دابەش دەکا..

خودایە چەن فەقیر بووین،

ئاخنراینە گەرووی ئاشی ئەنفالەوەو

سەرمان بۆ سولٚتان و

ژنەکانمان بۆ جەنگاوەرانی ئەنفال..

خودایە چەن بیٚ کەس بووین،

ڕۆکراینە سەردابەکانی ئەنفال و

لە مهاتەراتەکانی میٚژوودا،

میٚژوو نوسیٚک بەلاقرتیٚوە ووتی:

ئیٚژن ئۆمەتیٚک ئەنفال تاسانی..

هەموو لەحزەیەک،

ئەنفال میوانی ناوەختی بیٚئۆقرەیی ڕۆحمە..

خودایە چەن فەقیر بووین،

قومیٚ ئاو نەبوو بیخۆینەوە و
سێبەرێك نەبوو لە پاڵیا،
حیکایەتەکانی ئەنفال تەفسیر بکەین..
لە خەونما ئەنفال دێت و
دەفتەری شیعرەکانم دەسوتێنیٚ..
گودیلەی دایکم لەبنا دەبڕیٚ..
سەما بۆ سەر بوردەی تاوانەکانی خۆی دەکا..
گۆرانی بۆ سەرکەوتنەکانی خۆی دەچڕیٚ..
لای شەماڵەوە ئاگر لە پارچە گەنمە قەناری بەردەداو
خنجێر دەکا بەدڵی کلاٚکوڕیەکا..
لە خەونما ئەنفال دێت و
بیلبیلەی چاومان پڕ دەکا لە خوێن..
سەری سۆراخی سەخڵەتیمان بە لم دەسپێریٚ..
ئەنفال دێت مێوژەکانی مام زۆراب[*] پڕدەکا لە زەهر و
پۆرترێتەکانی ئاغالە[**] دەدڕێنیٚ..
ئەنفال دێت،
بێدەنگیەکانی چیای[***] دەتەقێنێتەوە..
پەرداخە چایەکەی مەهدی دەڕژێنیٚ..
ئەو،
ئەنفال،
دێت،
ڕیٚ بەبانگی مەغریبی سۆفیەکی نورانی دەگرێت..
ڕیشی ئاڵتونی خۆر دەبڕیٚ و
کەمەرەو
گوارەو
ئنگوستیلەو
گەردانەی،
شۆخێك هەڕاج دەکا..
نێو لەپی بەخەنەوە بوو نویٚ بوکێك،
شەقار شەقار دەکا..
ئەنفال هات،

شاعیری دیوانی(پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیان و

کوێستان)مەی گریاندو

پێی ووت:

تۆ کوڕی بێکەس ترین شاری و

ئەنفال بێکەس ترت دەکاو

ناتوانی گۆرانی بۆ شۆخێکی تری ئەم پیێ دەشتە بچڕێ..

ئەنفال،

دیوانی(خواو شارە بچکۆلەکەمان)ی ئەوی دزی

و

دەست نوسەکانی (فەریق ئەمین)ی ئەنفال کرد..

هەڵمەت،

وەرە دانیشە تەماشا،

تەماشا دانیشە وەرە،

تەماشا وەرە دانیشە،

سەیر..

سەیری ئەو جۆلانەیە بکە مناڵێک تیایدا،

پڕبە گەروو دەزریکێنیێ..

سەیر..

سەیری ئاوە سپی بکە چۆن بەخوڕ فرمێسک لەچاوی دیێ..

سەیر..

سەیری باوەشاسوار بکەن چەن بیێ زەوق لە دەوروبەر

دەڕوانیێ...

سەیر..

سەیری(مەهدی) بکە چۆن بە کوڵ دەگری و

مەنفاش ژیری نەکردەوە..

لە خەونما مەسیح لە درزی شکانی ئاسمانەوە،

بەترسەوە تەماشامان دەکا..

ئەنفال ئاسۆی بینینی مەسیحی لیێ یاساغ کردین و

ئێمەی بە سوتانی لم سپارد..

ئەنفال لەوەرزی داکردنیدا،

---

بەزەیەکانی مەسیحی ئیزن دا..

مەسیح نەیتوانی بە ئەنفال بڵێ:

خودا بەرداری نیە و

ئەم هەموو دڵ ڕەقیەت بۆ؟

مەسیح لە پاکانەکەی خۆیدا نوسی:

ئەنفال،

ویژدانی،

گشتمانی،

تنۆك،

تنۆك،

تکاند..

ئەنفال،

جێی،

بۆ،

مشتێ،

لە،

پیرۆزییەکانمان،

نەهێڵایەوە..

مەسیح..،

نەیتوانی دڵی سەخڵەتی ئەو پیرە پیاوە هێوەر کاتەوە،

کە بەکۆمە کۆم چوە بەردەمی وپێی وت:

تەنها کچێکم شك دەبرد،

ئەنفال بردی ونەگەڕایەوە،

ژنێکی قەیرە لەبەردەم مەسیحا،

کراسەکەی بەری کوت کوت کردو وتی:

جەرگ وهەناوم سووتا،

هەواڵی کەسە دوورەکانت بۆ نەهێناوم،

تارمایی رۆژ شکاو شەو بەپڕ شوقلەتەکانی(ئسمەت)

وە کەئابەی هێناو

مەسیح کەوتە نێو کەئابەکانی شەوەوە و بەتابووتی شەوی

وت:

بمگرە خۆ تا ئیتر رەزای ئەنفال نەبینمەوە.

لە،

ئەنفالا،

بیرمان،

کەوتەوە،

کە،

نەورەسێک،

ناتوانێ،

بمانگاتێ،

لە،

ئە،

ن،

فا،

لا،

بیرمان چوو جەوەنەیەک ئاو لەگەڵ خۆ ببەین،

نەمانتوانی دواماچی یەکتر لە فیراقا بکەین،

زاکیرەمان خیانەتی لێ کردین،

بەرد هاتە قسەو نەمانپەرژا ماڵئاوایی لا بکەین،

جرجێک بوو بەسوڵتانی بێ ڕەعیەتی نیشتمان،

کوونە بیەک بوو بەساحێب ماڵ،

کەش ناسێک هەواڵی بارانی غەزەبی هێنا،

نیشتمان بوو بەردەپێی چەقۆ کێشەکانی عۆجە،

نیشتمان پڕ بوولە لیکی عەبا بەسەرەکان،

سلاوات بۆ خۆاوەندێک دەدرا نەیگریتنە خۆ،

سێ ساڕۆکەیەک هەواڵی چۆڵەوانی ماڵەکانمانی ڕاگەیاند،

ئەنفال،

دوومەڵ بوو لە سەر مەمکی ژنەکانمان هەڵتۆقی،

خەرەکان بوو لە سەر دڵی گشتمان سەوز بوو،

پێستی سەرمانی لە فەلسەفەی خۆیدا توانەوەو

بوو بە واریسی پشتاوپشتمان،

ئەنفال،

پشکۆی ئاگردانەکەی خۆمانی خستە ژێر پێمان و

پشتیونەکانی خۆمانی بۆ کردین بە قەنارە،

گۆزەی ڕەیمانەکانی سەرسەکۆکانمانی وردو خاش کردو

ڕیمانەکانی لە مشتمانا هەڵپڕوکاند،

نوقڵەکانی سەر ڕەفەی ماڵەکانمانی داگرماندو
نوێژی فەرزی ئەنفالی لە سەر بەر ماڵەکانی خۆمان دابەست،
شەو نابالّقیەکانی ژێر سەرمان نووسی:
ئێوە،
نۆبەرەی،
نەوەیەکی،
یاخین، و
قامکی،
شەهادەتتان،
دەبڕین..
ئەنفال،
فیقنەی جوزەلەی شوانێکی شکاندو
پێی وت:
بۆ،
وەی،
نەتوانی،
لە،
بەردەم،
ڕەش،
بەڵە،
کێکا،
بەزمی،
چەپی،
بژەنی..
ئەنفال،
دەسکەوت بوو،
بۆ ئەوان گەوهەرو،
بۆ، ئێمە،
ش
سوو،
تان..
چەک بێواربووین خودایە،
جەستەمان بوو بە بەشێک لە زاکیرەی ئەنفال و

ڕۆحمان بوو بە توێشووی مەغریبانی ئەنفال،

چەن بێکەس بووین خودایە،

بوونمان لە ئافاتی ئەنفالا ون بوو..

هەناسەمان لە دووکەڵی ئەنفالا خنکا..

چەن فەقیر بووین خودایە،

ئەنفال ڕووتی کردینەوە لە خۆمان..

ڕووتی کردینەوەو

تۆی توێی گەنەموەکانی بن دەستمان،

بۆ دەسکەوت دەگەڕا..

چەن بێکەس بووین خودایە،

لە ئەنفالا تەژی کراین لە هیچ و

لە سەر تەختەڕەش،

ناوی هەموانیان بە هەڵاو گێڕاوی هەڵواسی..

چەن بێکەس بووین خودایە،

لە بێکەسیمانا مێژوو لە گێڕانەوەی وانەکانی خۆیدا،

فریوی خوارد..

مێژوونوسان قەڵەمەکانیان درۆیەکی گەورەیان،

بە بەرۆکی لاپەڕەی نوێترین کتێبەکانا هەڵواسی..

خەونمان دیبوو،

ئەنفال هیچ ڕەنگی وەک خۆی ناهێڵێ..

هیچ زیرۆحی بە هیواوە لە خۆناگرێ..

چەقۆی دەستی چەقۆ کێشەکانی دەکاتە شیرو مەی،

منالێک..

وەرە،

دانیشە،

تەماشا،

بە شوێن،

پێی،

ئەنفالا،

پرچی،

بە،،

پەلک،

کراوی،

محبووبە،

مان،

دیتەوە،

کە لە سەری نوسرا بوو:

بڵێن بە دایکم چراکەی پێکاو

ئیتر چاوەڕوانی با بەس بێ..

شەمسەری،

قەلا سپی لە چاوەڕوانی هەواڵێکی فەریدو کەسرانا،

چاوەکانی کوێربوون و

لە ڕێی نەوارێکەوە گوێ لە گۆرانیەکانی جبار دەگرێ..

ئەوتا،

سەیر،

چاوەڕوانی زەینمانی کاڵ کردەوەو

بۆ ئومێدەکانمان پەڕە پەڕەی دەفتەری مەزاقەکانی،

هەڵدایەوە..

لە لاپەڕەی یەکەمدا،

نوسرابوو:

بۆ ڕاهێنان لە سەر مەرگی چاوەڕوانی..

لە دوا لاپەڕیشدا،

نوسرابوو:

ماڵێکتان لە لم و خوێن بۆ چی دەکەین..

خودایە،

بە،تۆ،

هاتی،

بە،

پیری،

هەناسەی،

ڕۆحیانەتی،

پاکمانەوە،و

نە فریشتەیەکت نارد،

تا پێمان بڵێ:

نەمانتوانی سەبوریی دڵ تەنگیتان بین..

خودایە،

مێوەی چ باخچەیەکی یاساغمان نەڕنیبوو..

بزمارمان لە رێی چ خەلیفەیەکا دانابوو..

نەمانتوانی شمشێری غەزاچیەکانی ئەنفال بشکێنین..

فرمێسکی تەهارەتمان ڕژان و

خوڵقمان بە بێکەسی و بیٚ ئۆقرەیی خۆمان،

تەنگ بوو..

پاپایەک نەهات بیٚ ئۆقریمان بلاٚوێنیٚ و

پەنجەرەیەکمان لەم کەونە شەپڕیوە بۆ بکاتەوە،

تا لێیەوە،

تەماشای بێواری خۆمان بکەوین..

خودایە،..

تۆش،..

ئا،..

وەرە،..

تەماشا،..

ئەنفال،..

فرسەتی نەداین لە تەنیایمانا پڕ بە حەز بۆ خۆمان بگرین..

تەماشا،

ئەنفال،

شایەتەکانی

لە سەر،

تەختەی،

جۆلانەی،

مناڵەکانمان،

هەڵکوٚلی..

دارو

بەردو

پەلەوەرو

کانی و

دەشت و

دەرو

تەماشا،

چۆن هەموانی گریان و

**خۆر لە زەردەیەک کەوتە نێو مەنجەڵی شێوەی مەغریبمان و**

**لە نێوان نوێژی مەغریب و عیشادا،**

**کوتەڵی سووتانەکانمانی چێنەوەو**

**لە سەر بەرماڵی نوێژی عیشامان،**

**ڕێژەی غەنیمەکانی خۆی ڕاگەیاند..**

**ئەنفال،**

**فیرعەونی بۆ بینینی سووتانەکانی ئێمە هێنا..**

**ئەنفال،**

**خۆر لە زەردەیەک،**

**ئاوێنەی بەر هەیوانی حەوشەکانمانی وردو خاش کردو**

**گاڵۆکی دەست شوانەکانمانی وەرانو**

**نەیهێلا گۆزەیەک ئاو،**

**لە ئینجانەی گیا نەعناکانی سەرسەکۆی بەر حەوشەکانمان،**

**بکەین..**

**ئەنفال،**

**شەوێک کە سەرقاڵی لەیلەتوول قەدربووین،**

**پەراش پەراشی کردین و**

**لە سەر هەر پارچەیەکمان ناوی خۆی و**

**تەفسیرەکانی،**

**لە حەرفەکانی غەزای پیاو چاکانی نووسی یە وەو**

**لە گەڵ کازێودا،**

**بەری خۆری لێگرتین و**

**نشتمانی لێکردین بە دۆزەخ..**

**خەونم دیوە،**

**دایکم بە عەزرەتی برینەکانی ئەنفالەوە دەمرێ..**

**باوکم بە کەسەری ماچێکی ئەختەرەوە،**

**لە گۆڕ دادە بێژرێ..**

**مام فارس،**

**بۆ هەتایە بزە ناکەیتەوە سەر لێوی و**

**پریاسکەی خەمەکانی بۆ ماڵی تەنیایی دەپێچێتەوە..**

**کەسێک نایێت؟!کەسێک ناپرسێت؟!**

**کەسێک لا ناداتە لامان؟!**

**کەسێک،**

ڕیسالەی کۆتایی ئەنفال ڕاناگەیەنێ..

کەسێک،

نەتوانێ خوڵق بە تەنیاییەکانی مام فارسەوە،

بگرێ..

خەون دەبینم،

شاعیرەکەی شاکەل"33"..

بە دڵ شکاوییەوە،

بە قەڵەمە ڕیشێکی سپی چوون بەفرو

بە قەسیدەیەکی دڵ تەنگەوە،

دەچێتە لای ڕووباری سیروان و

دوای سلاَو بە حوزنەوە پێی دەڵێ:

زەحمەت،

بخمۆ،

قەسیدەیە،

بگەیەنە،

دیجلەو

پێی،

بڵێ،

ئێمەو

ئامانەت،

ئێسک و

پرووسکی،

کەسەکانمان..

شێخی شاعیر گریاو

وتی:

ئەمجارەیان شێروانە،

کە لێی دەدا،

تیشکی عەکسی خۆر ئاوا..

گوڵ و

گیا،

ناچێتە،

بەرگی،

بووک و

زاوا..

ئەو گریاو

شێروانەو

سیروان،

گریان..

ئەو،

گریاو

ئەنفال،

داباری..

ئەو،

گریاو

ئەنفال،

کانی،

دڵی،

سیروانی،

لێڵ،

کرد..

ئەنفال ڕەوە ئاسکەکانی دەشتی شێروانی ناراند،

شیر پەنجە بوو تێکەڵ خوێنمان بوو،

ڕەوێک پێچوە سوێسکی بە پارچەیەک شکارتەوە سووتان،

کە هات کوڵێ نانەکانی ڕووخاند،

چی قورعانی مزگەوتەکان بوو پەڕە پەڕەی کرد،

کە ئەنفال هات نە ئاسمان هەڵی دەکێشاین و نە عەرز

بە ئارامی قووتی دەداین،

گشتمان بینیمان تەسبیحە سەدو یەک دەنکیەکەی

(مەولەوەی) بڕینەوەو

(نالی) بۆ عەزابەکانی ئەنفال زیندوو کردەوە،

(گۆران)ی لە وەسفی سرووشت بێزران و پێی وت:

لە عەبابەیلێوە دەتبینم: نایەڵم جامی ئەم وەسفەشت پڕبێ

و

بۆ ساتێک هێمنی لە باوەشی خۆیدا بتخواتەوە..

خودایە وەرە تەماشا،

ئەنفال بە زەبری شمشێر..

له سەر دڵی گشتمان،د
یەیداخی سەرکەوتنی خۆی بەرزکردەوە..
مناڵێک،
پرسی:
ئەنفال،
چی له گەڵ باوکم بوو؟
کە بردی و
نەگەڕایەوە؟
سۆزێک،
بە سەر،
بوخچەیەکا،
کە لە ئەنفالا لەبیر چووبوو بدزرێ..
دەپچڕیکان و
دەیوت:
بگەڕێوە عەزیزی من.....
ڕۆحم لە تەنیایتا،
شەپۆلی ئازارەکانی بێ قەرارە..
بگەڕێوە هەناسەی من،
ئێستا بوخچەکەت هۆگری تەنیاییەو
چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسکی حەسەرەت..
بگەڕێوە ئارامی بێ ئۆقرەیی من،
لە کوێی؟
لە کام گۆشەی ڕەشی ئەم کەونەدا،
تۆ دەگریێت و
کەس گوێی لێت نیە..
بگەڕێوە،
بۆخچەکەت پڕە لە نهێنی و
خۆت نەبێ..
کەس تێ ناگا..

2001_2002 زینانە- ناوچەی داودە/ مەیدان- خانەقین

**پەراوێزەکان**:

1- ڕووبارێکە لەگەرمیان

2- وەکاشە ئەو ئیمامەیە کە چوار شەموان زۆربەی گوندییەکانی گەرمیان دەچوونە دیدەنی .

3- زنجیرە چیایەکی دیارو ناسراوە لەگەرمیان و بەمازووخ ناسراوە

4- پیاوێکی سادەو هەژاری گووندی ققەلاچەرمەڵەی گەرمیان بوو، کوڕو کچەکانی ئەنفال بری و خۆشی فڕۆکەکانی ڕژێم شەهیدییان کردو دوومانگ تەرمەکەی بەچۆڵەوانیەوە بوو، چوونکە کەس نەیدەوێرا بچێتە ئەو ناوچەیە، دواتر هەرلەشوێنی شەهیدبوونەکەیدا تەرمەکەی کرا بەچێر خۆڵەوە

5- مەبەستم باپیرو داپیری خۆمە

6-هەمان مەبەست

7+8 – دوومامۆستای ئاینی گووندی قەواڵی و تووکن بوون لەگەرمیان

9- دانیشتووی گووندی پیرەمەوەنی بوو لەگەرمیان

10 – ئەو گووندەیە بیست و پێنج پارتی زانی شیوعی و یەکێتی تیا شەهید بوو لەپەلاماری ئەنفالدا

11 – ئافرەتێکە تاك و تەنیا خۆی لەپەلاماری ئەنفال قووتاری بوو

12 – بەلووتفترین پیاوی گەرمیان بوو، کەئەنفال هات قسە خۆشەکانی ئەویش نەما

13 – پێشمەرگەیەکی پارتی زانی شیوعی بوو، گەلە جاشێك دوای ئەنفال شەهیدیان کرد

14 – پێشمەرگەیەکی پارتی زان بوو، دەزگیرانەکەی ئەنفال بردی و نەگەڕایەوە

15 – شمشاڵ ژەنێکی گەورەی گەرمیان بوو، تائەو ساتەی قوڵ بەستیان کرد شمشاڵەکەی لەمستا بوو

16+17 – دایك و کچی شمشاڵ ژەنەکە بوو لەنووگرە شەهید بوون

18 – شێتێکی گەرمیان بوو

19 – شێتێکی تری گەرمیان بوو لەبنەکەی خەپەکوێر

20 –یەکەم شەوی بووکێنی بوو، دوای یەك کاتژمێر کەوتە نێوان لێشاوی ئەنفال و دیار نەمان

21 – مەبەست لەو شۆخەیە کە(لەتیف فاتح)ی شاعیری هاوڕێم لەدەقێکدا هۆگری بوەو بۆی دەگری

22 – فەرماندەیەکی پارتی زانی شیوعی بوو

23 – ئەو گووندەی ناوچەی داودە بوو لەگەرمیان بەرگرییەکی سەختی لەپەلاماری ئەنفالدا تیا کرا

24 – پێشمەرگەیەکی پارتی زانی یەکێتی بوو لەو گووندەدا شەهیدبوو

25 – جێژوانی شۆخانی گووندی قەلاچەرمەلە و پیرەمەوەنی بوو

26 – مەبەست لەکتێبی پۆلی یەکی سەرەتاییە

27 – هونەرمەندی شێوەکار ڕۆستەم ئاغالە

28 – هێمایە بۆ دەقێکی شیعری عیسا چیایی شاعیر

29 – دیوانە شعرێکی لەتیف هەڵمەت

3 – نووسەری جوانە مەرگی گەرمیان فەریق ئەمین

31 – دیسان هەڵمەتی شاعیر

32 – مەبەست لەمەهدی ساڵەحی شاعیرە

33 – مەبەست لەشێخ ئەحمەدی شاعیرە